نـــــاوی کتێب: جوانیە نەبینراوەکان

نــاوی نووســەر: نــەهـــــا حەسەن

هـــــەڵەچـــن : ســــەلمـان کـوردی

دیزاینی ناوەوە و بەرگ : زەردەشت کاوانی

نۆبــەتـی چــــــاپ:  یــەکـــــەم ٢٠٢٢

تـیـــــــــــراژ:  ١٠٠٠ دانـــــــە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی (٣٩٩) ی ساڵی ٢٠٢٢ پێدراوە

# جوانیە نەبینراوەکان

نووسینی

نەهــــا حەســەن

# پێشەكی

## بۆچی ئەم كتێبەم نووسی؟

بەردەوام هەســــتم بەوە كردووە ئێمەی مــــرۆڤ بە هەموو نەتەوەكانەوە نابێ بەو شێوەیە بژین كە ئێستا دەژین، پێویستە هەر یەكەمان شوێنە لاڕەكانی ژیانی خۆمان ڕاست بكەینەوە نەوەك لە بەرەوپێشبردنی رووكاری ژیانكردنمان، بەڵكو دۆزینەوەی ڕاستیە جوانە ونبووەكان بۆ ئەوەی بە جوانیەكی زۆرەوە ژیان بكەین نەوەك ئەوەی ژیانێكی هەڵخەڵەتێنەر بژین و بە جۆرێك سەربنێینەوە كە ئێمە هەر نەزانین لەو ژیانەی كە چەندەها ساڵە لە سەری دەژین، پێم جوانە مرۆڤ بە كاتێكی كەم جوانیە ونبووەكانی ژیانی خۆی بدۆزێتەوە نەوەك ئەوەی سەر بنێتەوە و ڕاستیەكانی ئەو شوێنە نەزانێت كە لەسەری ژیاوە، پێویستە پەردەكان هەڵبدەینەوە و چاومان بكەینەوە .

# دەم و دڵ

لە جەستەی مرۆڤدا هەموو ئەندامەکان پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە، بەڵام دەم و دڵ پەیوەندیەکی سەیریان بە یەکەوە هەیە، چونکە گوێم لێبوو رۆژێکیان گفتوگۆیەکی سەیریان دەکرد، دڵ دەیگوت من گلەیەکی زۆرم لە تۆ هەیە، تۆ هیچ قسەیەك ناکەی کە من دەمەوێت بیکەیت، تۆ نازانی من چەندە ئازار دەچێژم کە ئەو وشە و رستانە لێرەدا هەڵدەگرم، دەم گوتی من دەزانم تۆ بە ئازارەوە لە وڵاتی خۆتدا هەڵیان دەگری، بەڵام من نامەوێ وابکەم، چونکە دەترسم گەر وابکەم وڵاتی بەرامبەرمان دەوڵەتەکەیان پڕ



بكه‌ن له‌ چه‌قۆ و چه‌ك و رۆژێك له‌ رۆژان ببێته‌ هۆی شكانی وڵاته‌كه‌مان، پارچه‌ پارچه‌ بوونی وڵاتی خۆشه‌ ویستی، چونكه‌ ده‌زانم كه‌ ئه‌مه‌ روویدا هه‌ر پارچه‌یه‌ك به‌ هۆی چۆقۆیه‌كه‌وه‌ به‌ره‌و لایه‌ك ده‌ڕوات و قه‌ت یه‌كتری ناگرنه‌وه‌، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هیچ كام له‌ پارچه‌كان هاوڕا نابن له‌گه‌ڵ یه‌ككگرتنه‌وه‌، چونكه‌ هه‌ر یه‌كێكیان ئازارێكی وه‌سف نه‌كراوی له‌ ناو وڵاتی دڵی خۆیدا شاردۆته‌وه‌ .

٢٠٢١\١١\٣

# جوانبینی نابینایەک

من نابینام، بەڵام جوان دەبینم، رۆژێکیان لە باخچەیەك دانیشتبووم مێرد منداڵێك بە گاڵتەوە پرسی «مامە تۆ چۆن دونیا دەبینی»؟ منیش دوور لە گاڵتە وەڵامیم دایەوە گوتم «زۆر بە جوانی دەیبینم کوڕی خۆم»، وتی چۆن؟! گوتم من جیهانی خۆم پێ لە جیهانی هەر کەسێك روناکترە بە جۆرێك کە روناکیەکەی وام لێدەکات نەوەك تەنیا دەرەوەی شتەکان بە جوانی ببینم، بەڵکو ناوەوەشیان بە جوانی ببینم، تۆزێك لەو جوانیە لە ناو



ئەو منداڵانەدا دەبینمەوە کە لە یاریگای قوتابخانەدا خەریکی یاریکردنن، وەکو ئەو پیاوەی کە لەسەر حەق سزا دەدرێ، وەك ئەو دایکەی کە نازانێت چۆن سکی منداڵەکانی تێر بکات، وەك ئەو گەنجەی کە لە شارەکەیدا هەست بە مردوویی هەمووان دەکات جگە لە خۆی، من دونیا زۆر روون و رووناك دەبینم، بەڵام زۆر جار تاریکی چاوی مرۆڤەکانە پەنجەرەی چاوی منیش لیڵ دەکات کوڕی خۆم، مێرد منداڵەکە پێکەنی و گوتی مامە گیان تۆ لەسەر هەسارەیەکی دیکە دەژیت و دەستیکرد بە رۆیشتن .

٢٠٢١\١١\٢

# زەلكاوى رازاوە

دە ورى ئێوارە بوو لەسەر شاخێك دانیشتبووم و خەریكى نوسینى كتێبەكەم بووم لە ناكاو بینیم كیسەڵێك بە خاوەخاو دێت، مارێكیش خەریكە لێی نزیك دەبیتەوە، لە بیرمدا وامزانى مارەكە بە نیازى خواردنى لێی نزیك دەبێتەوە، بەڵام شتێكى



سەیر روویدا، تا مار و كیسەڵەكە بە تە واوى لە یەك نزیك بوونەوە، بە ســـــەرسوڕمانەوە كیسەڵ دەستیكرد بە قسەكردن، گوتى ئەوە تۆ چـــى دەكەى لێرە خـــۆ تۆ گوتت دەڕۆم بەرەو شــــوێنێك وەكو بەهەشت وایە، خۆشى نەبڕاوەى لێیە دەتوانم خۆشترین ژیان بژیم

لەوێ، ئێستا بۆچی پاش ئەو هەموو ڕێگایە گەڕایتەوە؟ خۆ من بەدەم خەیاڵەوە خەریك بووم دەهاتم بۆلات، هەرکاتێکیش ماندوو دەبووم، ئە و وەصفانەم بیر دەهاتەوە کە تۆ دەتکردن، ماندوویەتیم لە بیر خۆم دەبردەوە، دەمگوت وای دەبێت من کەی بگەم بەو شوینە؟ چی بوو؟ چی ڕوویدا؟ بۆ گەرایتەوە؟ مار بە ئاخێکەوە گوتی ئای خۆزگە وەك تۆ هێواش دەبووم و قەت نەدەگەیشتم، خۆزگە ئەو شتانەم نەدەبینی، خەفەتە گەورەکە ئەوەیە ئەوەی بیرم لێدەکردەوە نەوەك هەر ئەوە نەبوو، بەڵکو پێچەوانەکەی بوو، منیش لە شوێنی خۆمەوە هەناسەشم نەدەخواردەوە بۆ ئەوەی بتوانم بە جوانی گوێم لە قسەکانیان بێت، کیسەڵ گوتی دە خێراکە پێمبڵێ چی ڕوویدا؟ مار گوتی من وامدەزانی ئەو هەموو ڕێگایە دەبڕم دەگەم بە وڵاتێك کە نەوەك هەر مرۆڤەکان، بەڵکو منیش مافم دەبێت، نەوەك هەر مرۆڤەکان بەڵکو منیش دەتوانم هەستەکانی خۆم دەرببڕم و مافی تەواوی ژیانم پێبدرێت زیاتر لێرە، وامدەزانی وڵاتێکە هەمووان ڕێز لە یەکتری دەگرن، بەڵکو ئاژەڵێکی وەکو ماریشیان خۆشدەوێت نەوەك هەر سەگ و پشیلە، وامدەزانی دەگەم بە وڵاتیك کە گەورە بە خۆشەویستیەوە ئاگای لە بچکۆڵە دەبێت، وامدەزانی دەگەم بە شوێنێك هەموو شتێك دەکەن بە قوربانی دڵی یەکتر و دڵخۆشی و ژیان، من لە کونی مەزراکانەوە دەمبینی چۆن نرخ و بەها لە یەکتری دەستێننەوە،

وامدەزانی هەمووی یەك مەبدەء دەیانگرێتەوە كە ئەویش پاكیە، بەڵام نەوەك هەر وانەبوو، بەڵكو خراپەیان بەرامبەر یەكتری باس ناكرێت، جا چ جای بەرامبەر ماریك، من كە ئەو شتانەم بینی ترسام و بە پەلە دەستمكرد بە گەڕانەوە، چونكە دەترسام شتی دیكە ببینم وهەر لەوێ بتۆقم و بمرم، زۆر ماندوو بووم، بەڵام لەوەوە فێربووم كە هەندێكجار شتەكان باشن نابێ هە ولْدەین بەرەو باشتر، چونكە گەر من توانام نەبوایە بگەڕێمەوە لە وێ بەو دەردە وە دەمردم، كیسەڵ گوتی تۆ چۆن ئەو هەموو شتانەت بەو كاتە كەمە زانی، گوتی پێویستی بە كات نەبوو هەموو شتێك لەسەر شەقامەكان ڕوویاندەدا، وەرە با بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە، ژیانە بێسنوورە خۆشەكەی خۆمان تەواو بكەین، چیماندا وە لەو بوونەوەرانە، خەمت نەبێ ئێمە تەواوێك لێیان دوورین ناگەن پێیان، دونیا بەرەو تاریكی دەڕۆیشت و ئەوان ڕۆیشتن منیش هەستام و ڕێمكردەوە بەرەو ئەو دەوڵەتەی كە مار باسی لێدەكرد.

# مۆسـيقـا

سڵاو من مۆسیقام دڵخۆشم كه‌ مرۆڤه‌كان ئه‌و هه‌له‌یان به‌من داوه‌ كه‌ په‌یامم بگه‌یه‌نم، من لێره‌دا هه‌ر وه‌ك خۆم قسه‌ ناكه‌م، به‌ڵكو وه‌ك هه‌موو مۆسیقای جیهان، من هه‌رده‌م ده‌مویست ئه‌وه‌ ڕوون بكه‌مه‌وه‌ كه‌ خه‌ریكم لێ ده‌درێم، به‌ هه‌وادا ده‌ڕۆم، ئه‌وه‌ ڕوونبكه‌مه‌وه‌ كه‌ خه‌ریكی ده‌ربڕینی مۆسیقایه‌ك نیم، به‌ڵكو باسی



چیرۆكێك دەكەم كە فرمێسك و ئازارەكان بوون بە مۆسیقا و منی لێ درووست بووم، خەریك بووم دەمویست كە ئەو فرمێسكانە بنەخشێنم كە هاتوونەتە خوار و لەلایەكی تریش دەمویست ڕۆژە خۆشەكان بهێنمەوە و یادگاریەكان نوێ بكەمەوە، من بە خۆم باسی مێژووم دەكرد نەوەك شادی و چێژی چەند ساتێك، دەمویست ڕەنگاوی خۆم لە هەموو بەشەكانی ژیانی مرۆڤەكان ببینمەوە، بەبێ مۆسیقا شتەكان مانای خۆیان نادەن، هەموو شتێك بێمانا دەبێت، مۆسیقا ڕۆحی شتەكانە، ئەو ڕۆژە بە ڕۆژێكی مردوو دادەنێم كە مۆسیقای تێدا نەبووە.

٢٠٢١\١٢\١٤

# تـابلـــۆ

سڵاو هه‌ر وه‌ك مۆسیقا منیش بۆ چه‌ند خوله‌كێك مۆڵه‌تم پێدراوه قسه بكه‌م، ئه‌زیزانم من تابلۆم كه پێكهاتووم له ره‌نگ و مانا و هه‌ست، گه‌ر هه‌ر كامێكیان نه‌بێ منیش نابم، هه‌روه‌ها مۆسیقاش نه‌بێ من نابم و من و مۆسیقای هاوڕێم به یه‌كه‌وه ژیان



درووست دەکەین، من هەردەم دەمەوێ لە مرۆڤەکان بگەیەنم کە من نەخشی سەر پارچە کاغەزێك نیم، بەڵکو ژیانم لە ناو ئەو پارچە کاغەزە، کە سەیرم دەکەن دەبوایە ئەو ژیانە لە کاتی سەیرکردنی مندا لەسەر واقیع درووست بووبایە، دەبوایە ژیان ڕەنگاوڕەنگ بوایە، دەبوایە ئاسمان شین، باخچەکان سەوز، بەڵام ئێستا ئەم جیهانە هەمووی ڕەش و سپییە، چونکە مۆسیقا لە ڕەنگەکانم سەندراوەتەوە.

٢٠٢١\١٢\١٤



# ژیانم لە گەشتدا

**(زەوی= قیامەت) (سەفەر= ژیان)**

لە ناکاو خۆم لەسەر مەریخ بینیەوە، نەمزانی چۆن هاتووم؟ بۆچی هاتووم؟ چی بکەم؟ چۆن گەیشتم بە ئێرە؟ گوتم با پێش ڕۆیشتنم ڕۆمانێك بنووسم، دانیشتم و زەویم لێدیاربوو لە دوورەوە وەکو تۆپێکی زۆر بچووك، بەڵام دەمزانی ئەو تۆپە بچووکە لە ڕاستیدا ئەوەندە بچووك نیە، بەڵکو توانای بینینی من ئەوەندەیە، وازم لە سەیرکردنی هێنا و دەستمکرد بە نووسینی ڕۆمانەکەم.

پاڵەوانی ڕۆمانەکەم ناونا سەفەر، سەفەر کوڕێکی جوان بوو، بەڵام زۆر جار ڕەفتارەکانی بە دڵی مرۆڤەکان نەبوون، بەڵام هەردەم ئەوانەی دەورووبەری ڕەفتاری سەفەریان دەبینی نەوەك جوانیەکەی سەفەر زۆر بەوە دڵتەنگ بوو، بەڵام سەیرترین شت ئەوەیە خەڵکی پێشبینی زۆریان لە سەفەر هەبوو، بێئاگا لەوەی سەفەر تەنیا منداڵێکی بچووکی دە ساڵانە، سەفەریش زۆر جار کارەکانی بۆ دەکردن، بەڵام کە بۆی نەدەکردن خەڵکەکە دیسان توڕە دەبوونەوە و هەر هەموویان سفر دەکردەوە، زۆر جاریش دەیگوت

خۆ کەسێك نیە سوپاسم بکات، بەڵام هەر بەردەوام بوو لە هەموو شتێك، لە ناکاو شوشەیەك لە زەویەوە کەوتە سەر مەریخ دوو نامەی تێدا بوو، دانەیەکیان دەیگوت دڵنیابە لەوەی ئەو زەویەی دەیبینی هەر ئەوەندەیە و گەورەتر نیە و ژیانی تێدا نیە، ئەوەی دیکەیان دەیگوت زەوی رووبەرێکی گەورەیە و زۆر گەورەترە لە وەی دەیبینی، یەکێك لە نامەکانم هەڵگرتوو دەستمکرد بە گەڕانەوە بەرەو زەوی.

٢٠٢١\٢\٥



# وەرزەكان

كەس نازانێت هەر یەكێك لە ئێمە لە ناو خۆیدا چ وەرزێكی شاردۆتەوە، نازانین هاوینە، ئایا ئەو كاتەیە هەڵە دەكەین و بیری لێناكەینەوە، یان وا پایزە و وردە وردە خەریكی وەراندنی هەڵەكانمانین، یان خەریكە زستان دێت و لەناو ناخی گەورەیی هەڵەكانمان سڕ دەبین یان بەهارە و گوڵەكان ئامادەن جوانیەكانی خۆیان پیشان بدەن، جا وەرزی هەر یەكێكمان جیاوازە لە هی ئەوی دیكە، پایزی من جیاوازە لە پایزی تۆ هەر یەكێكمان گەڵای جیاواز هەڵدەوەرێنین .



# گوڵ و پایز

من گوڵێکی تەنیام لەسەر شاخێکی دوور، دوور لە ئاوەدانی هیچ شتێکم لێدیار نیە، تەنیا ئاسمان نەبیت، بەڵام ئاساییە، چونکە ئەوەی لام گرنگە ئەوەیە بتوانم دەورووبەری خۆم ئاوەدان بکەمەوە و بیکەم بە گوڵستانێك، کاتێك مرۆڤەکان لە جامی ئۆتۆمبێلەکانیانەوە دەڕوانن بە دەرە وەدا، بتوانم دیمەنێکی جوان ببەخشم، من گوڵم دەبێت پێش ئەوەی پایز بێت و هەڵموەرێنێت، خۆم خۆم هەڵوەرێنم نەوەك بەشێك لە جوانیەکەم، بەڵکو خۆم



ببەخشم بە خاك، ئەوەش دەزانم کە وەفای نابێت بۆم، چونکە هەرگیز ناتوانم وەفاداریەکەی ببینم لەبەر ئەوەی ئەو کاتە من هەڵوەراوم و لە ژێرخاکم، بەڵام قەت دڵتەنگ نابم، چونکە من خۆم بدەم بە پایز باشترە لەوەی خۆی تینم بۆ بێنێ و بەهارم لێبستێنێ، ئاسوودەم، چونکە من خۆم خۆممدا بە پایز و ئامادەبووم، من ڕقم لە پایز نیە، چونکە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو دەیەوێت ئامادەکاری بۆ بەهار بکات و دیمەنێکی جوان بدات بە مرۆڤەکان، گەر من دەستم هەبوایە و بمتوانیبایە بە دەستەکانم دەورووبەرم بکەم بە گوڵستان ئەو کات دەبووم بە دڵخۆشترین گوڵ، بەڵام ئێستاش دڵتەنگ نیم، چونکە دەتوانم خۆم ببەخشم و ببم بە بەشێك لەو گوڵستانە.

٢٠٢١\١١\٢



# کیشوەرە جیاوازەکان

کەس لە هەستی کەسێك تێناگات کە تەنیا چەند ڕۆژێکی ماوە لە ژیان، هیچ کەس لە هەستی ئەو کەسە تێناگات کە دەچێتە قوڵایی دەریاوە بۆ دۆزینەوەی مرواری، هیچ کەس لە هەستی ئەو قوتابیە تێناگات کە دەربەدەر ڕێ دەکات بۆ گەیشتن بە





مامۆستاکەی، کەس لە هەستی ئەو مرۆڤە تێناگات کە گەورەترین مامۆستایە بۆ نەفسی ڕابردووی خۆی، کەس لە هەستی ئەو کەسە تێناگات کە خەریکی قوتدانی شتەکانە بۆ پڕکردنەوەی ناوەوەی خۆی، کەس لە هەستی ئەو ئەڵماسە تێناگات کە لە دەشتێکدا کەوتووە، کەس لە هەستی ئەو کەسە تێناگات کە کەوتۆتە دەریاوە و توانای هەستانەوەی نیە و خەریکە دەخنکێت، هیچ کەس لە هەستی فرمێسك و چاو تێناگات کە ویستوویانە چی بڵێن، هیچ کەسیش لە هەستی فڵچە و دەست تێناگات کە ویستوویانە چی بنەخشێنن جا وای لەوەی گەر ویستبیان و نەیانتوانیبێت.

# گۆڕستانی ڕووناکی

لەژێر خاکم و گوێم لە کۆچی شەوقەکانە (ڕووناکی)، گوێم لە شرقەی ڕووناکیەکانە، گوێم لە فرمێسکەکانە، گوێم لەو دوا چرکە ساتانەیە کە خەریکن بەرەو لامان دێن، گوێم لە بێدەنگیەکانە، گوێم لە شرقەی دڵەکانە، شرقەی دڵەکان دەمترسێنێ، ئاوازی هیچ شرقەیەك لەوەی دیکەیان ناچێت، بەڵام ئاساییە، چونکە ڕۆژێك لە ڕۆژان منیش گوێم لە شرقەی خودی خۆشم بووە و تەنیا منم کە دەتوانم وەصفی ئاوازی شرقەکەیتان بۆ بکەم.



سوودی چیە دێن بۆ سەر گۆڕەکەم و نازانن من کێم، سوودی

چيه كه دەگرين گەر من ناخم زەريايەك بێت و پێكهاتبێت له فرمێسك، ئێمه ڕۆژانه خەريكين له ژێر ئێرەدا بۆ يەكتری دەگرين، بەڵام هيچمان ناتوانين نرخی ته واوی فرمێسكەكان به يەكتر بدەين، خەريكين له ژێر ئێرەدا هەوڵدەدەين شارێكی ڕووناك دروستبكەين به خەياڵ و ئاواتی ئەوەی لەسەر ئێره دروستمان بكردبايه، با ڕووناك نەبێ، قەت حەزناكەم دوای من شار ڕووناك بێت، نەكا ئەوەی نرخی خۆم بيربێتەوە، دەمەوێت خۆمم بيرچێتەوە و خۆمم لێ ون ببێت، سەردانی من مەكەن سەردانی خۆتان بكەن له جياتی ئەوەی ڕۆژێك له ڕۆژان سەردان بكرێنەوە.



# تاریکی شەو

تاریکی شەوە و دانیشتووم سەیری ئاسمان دەکەم، زۆر دەترسم نەکا ڕۆژ نەیەتەوە و بەیانی نەیەتەوە، ڕووناکی مانگ ڕۆژم بیر دێنێتەوە، ریێ دەکەم، بەڵام دەنگەکانی ناو مێشکم دەڵێن مەیکە، بەڵام دەیکەم، چونکە دەزانم گەر لەم تاریکیەدا ونیش بم



سەیری ئاسمان دەكەم و مانگ دەدۆزمەوە و دەگەڕێمەوەماڵەوە، مانگ بەشێك لە ڕووناكی ڕۆژم بیردێنێتەوە، هیوادارم ئێرە وەك ئەوە تاریك نەبێت كە دەیبینم، تەنیا پەڵەیەكی سەر چاوم بێت، هیوادارم ڕۆژ بێتەوە و پەڵە تاریكەكانی سەر چاوم ڕەشببنەوە و نەیان بینمەوە، لە ترسی نەهاتنەوەی ڕۆژ خەریكە دەتۆقم، لێم گەڕێن با بڕۆم و ون ببم و خۆمم بیرنەمێنێ، بەڵام دڵنیام ڕۆژ دێتەوە و پەڵە تاریكەكان دەسڕێنەوە.

٢٠٢٢\٢\٩

# وشــــە

سڵاو هاوڕێیانی ئازیز من وشەم یان دەتوانم بڵێم چەند هەستێکم یان بیر و بۆچوونێکم کە دەردەبڕدرێم، لە هەر جێگایە و بەشێوەیەکم. هەندێکجار ئەو کۆتا وشانەم کە کەسێك خەریکە ژیان بەجێدەهێڵێ، هەندێك جاریش ئەو سەرەتا وشانەم کە مرۆڤێك خەریکە لە سەرەتای ژیانی دەیانڵێت، هەرجارە و بەجۆرێك لە دڵی مرۆڤەکانەوە دێمە دەرەوە، هەربەو جۆرەش دەگەم بە دڵی مرۆڤەکانی بەرامبەر، هەندێکجار دەتوانم ناخ هەژێنترین وشەکان بم وهەندێك جاریش پڕ لە خۆشەویسترین وشەکان بم، من لە هیچ شوێنێک دووبارە نابمەوە، چونکە لە هەر





شوێنه و جۆره هەستێكم لەگەڵ خۆمدا هەڵگرتووه كه له هیچ شوێنێكی دیكه ناتوانم جۆره هەستێكی وا لەگەڵ خۆمدا هەڵگرم، من له چركه ساتی وتنمدا له دایك دەبم، بەڵام مردنم دیار نیه له ناو دڵی مرۆڤەكاندا و هەندێك جاریش هەر له دایك نابم، چونكه مرۆڤەكان له ناو دڵی خۆیاندا دەمشارنەوه.

٢٠٢٢\٢\٩

# شنەبای تەمەنم

لە شوێنێكدا ڕاوەستابووم و شنەبایەك هات و دەستمكرد بە ڕۆیشتن، هەستم بە چركە بە چركەكان دەكرد، هەستەكانم بە جۆرێكی سەیر لەگەڵ ئەو شنەبایە تێكەڵ بوون، خەریكی ڕێكردن بووم بەو جۆرەی كە زۆرجار خەریك بوو ئاگام لە خۆم نەمێنێ و ڕێ هەڵە بكەم، خەریكی ڕێكردن بووم وەك ئەوەی ئەو شنەبایە هەمیشەیی بێت، وا قوڵ بووبوومەوە لە شنەبایەكە كە پێناسەیەكی سەیر و جیاوازم بۆ داهێنا بە پێی ئەو هەستانەی كە لە چركە ساتەكاندا چەشتبووم، بۆ چركە ساتێك ویستم سەرم بسوڕێنم و سەیری ئەو چەن مەترە بكەم كە تێمپەڕاندووە شنەبای تەمەنم كۆتایی پێهات.



# کۆڵانە کپەکە

شەوی هەینی بوو لە ناو ئۆتۆمبێل دانیشتبووم سەیری مرۆڤەکانم دەکرد، هەر یەکێکیان ڕابردوویەکی هەڵگرتبوو، هیچ کامیان لەوەی دیکە نەدەچوو، ئەو مرۆڤانەی من دەمبینین دەرەنجامی ڕابردوو بوون هەر یەکەیان جۆرە نهێنی و هەست و ئازارێکی لەناو خۆیدا هەڵگرتبوو، زۆر حەزم دەکرد هەر یەکەیان ڕابوەستێت تۆزێك لە ئەزموونەکانی خۆیم پێ بدات، بەڵام ڕێك بە خۆمم گوت نەها تۆ ناتوانی ئەزموونەکان وەربگریت بەبێ چەشتنی هەستەکان، بەڕاستی شەوێکی کپ و بێدەنگ بوو، ڕابردووەکان بە کۆڵانەکان ڕێیان دەکرد، جا هەندێکیان بەئازارەوە خەریکی ڕێکردن بوون، ئەو ئازارانەی کردبوو بە بەشێك لە خۆی و هەر بە هی خۆشی دەزانی، سەیری ئەوان لەوەدابوو هیچیان نەیان دەتوانی بۆ چرکە ساتێکیش ئازار و یادگاریەکان ون بکەن، جگە لە قبوڵکردن ڕێگە چارەیەکی دیکەیان نەبوو، چونکە خۆیان ون دەبوون.

له‌گه‌شتێكدا خه‌ریكی ڕێكردن بووم، له‌ ڕێگادا فێربووم دڵم بخه‌مه‌ ژێر خاك، له‌و كاته‌وه‌ شته‌كان گۆڕان، ده‌كه‌وتمه‌ ناو ده‌ریاوه‌، به‌ڵام نه‌ده‌خنكام، ده‌كه‌وتمه‌ دارستانه‌وه‌، به‌ڵام ون نه‌ده‌بووم، له‌ ده‌ریای خوێندا مه‌له‌م ده‌كرد، به‌ڵام خوێناوی نه‌ده‌بووم، له‌ كۆڵانه‌كانی ده‌وڵه‌تی ئازاردا پیاسه‌م ده‌كرد، به‌ڵام وون نه‌ده‌بووم، وای لێهاتبوو له‌ هه‌موو كۆڵانه‌كانی ده‌وڵه‌ته‌كه‌مدا پیاسه‌م ده‌كرد، رق، تۆڵه‌، خیانه‌ت، خۆشه‌ویستی، ئاشتی و بێ وه‌فایی، به‌ڵام له‌ هیچ كامێكیان ون نه‌ده‌بووم، له‌ كۆڵانه‌كاندا مۆسیقا لێده‌درا گوێم لێ نه‌بوو، به‌ڵام سه‌مام ده‌كرد، باران نم نم ده‌باری، به‌ڵام ته‌ڕ نه‌ده‌بووم، له‌ دوای ڕۆژێكی درێژ گه‌ڕامه‌وه‌ ماڵه‌وه‌ چوومه‌وه‌ ژووره‌كه‌م و له‌سه‌ر كورسیه‌كه‌م دانیشتم، ڕۆژان پێویستیم به‌ هه‌ڵكردنی چرا نه‌بوو، ژووره‌كه‌م به‌ چوونه‌ ژووره‌وه‌ی من ڕووناك ده‌بۆوه‌، به‌ڵام ئه‌و شه‌وه‌ چه‌ندین چرام هه‌ڵكرد هێشتا وه‌ك پێویست ڕووناك نه‌بوو، ده‌ستم برد بۆ قه‌ڵه‌مه‌كه‌م بۆ ئه‌وه‌ی بنووسم چه‌ند ده‌منووسی هیچ شتێك نه‌ده‌نووسرا، دیاربوو پێنووسه‌كه‌م لێم زیز ببوو، بڕیارمدا بگه‌ڕێمه‌وه‌ ئه‌و شوێنه‌ی كه‌ دڵم لێی له‌ده‌ستدابوو.

# ناوەڕۆک



## نووسەری ئەم کتێبە : نەها حەسەن

لە ٢٠٠٦/٨/٢٠ لە دایک بووە لە شاری رانیە و لە ئێستادا دانیشتووی شاری هەولێرە، ئێستا لە قۆناغی ١٠ ی ئامادەییە، نووسەر لە چەندان کەناڵی ئاسمانی بانگهێشتکراوە، بەهرەی خۆشنووسی هەیە و هاوتەریب لەگەڵ ئەمەشدا خاوەنی شەش پێشانگای وێنەکێشانی کاریکاتێرە، هەر لە بچووکیەوە شەیدای خوێندنەوە بووە و خاوەنی دیدگایەکی مەزنە بۆ داهاتووی خۆی.